# مقدمة
# في التأريخ
# الاسلامي الكردي

باللغة الكردية

بقلم
هادي علي

× ناوی کتێب : پێشه کی یه ک بۆمێژووی ئیسلامی کورد
× ناوی دانه ر : هـادی علـی
بلاوکه ره وه : کتێبخانه ی ڕۆشنبیر - سلێمانی-
× چاپی / دووه م
× ١٤١٤ ک ١٩٩٣ ز

" ١ "

کاتێ ئەم پێشەکی‌یە ئەنوسین ، مەبەستمان ئەوە نیە کە دەربارەی مێژووی نەتەوەیی یان هەرێمایەتی کورد بکۆڵینەوە · بەڵکو مێژوی یەکێك لەگەلانی ئیسلام روون ئەکەینەوە کە لەبنیات نانی شارستانێتی ئیسلامی‌دا دەورێکی بالای هەبوە ·

مێژووی ئیسلامی بریتی نیە لەمێژوی کەلی عەرەب بەتەنیا ، بەڵکو بریتی‌یە لەمێژوی هەمو ئەو گەلانەی کە لەسایەی ئیسلامدا بەشێوەیەکی واقیعی ژیاون · کەلی کوردیش یەکێکە لەو کەلانەو جێگای تایبەتی لەمێژوی پرشنگداری ئیسلامدا گرتوە · بۆیە پێویستە گرنگی‌یەکی تایبەت بەمێژوی ئیسلامی کورد بدرێت ، چونکە تا رادەیەکی زۆر پشت گوێ خراوەو بەدەستی ئەنقەست دەستکاری‌و گۆرانی تێدا کراوە ·

ئێمە لێرەدا لەو کەسانە نین بۆ کەلی کورد بکرین‌و داوای بەزەیی‌و لێبوردنی لەعەرەب‌و کەلانی تر بۆ بکەین‌و سۆزی خەلکی بۆ بجوولێنین ، چونکە کەلی کورد زۆر لەوە گەورەترو پایە بەرز ترە ·

ئێمە ئەمانەوێت راستی‌یەکانی مێژو بخەینە پێش چاو بۆ ئەوەی بزانین کە تا چ رادەیەك دەستکاری مێژوی کەلانی ئیسلام کراوەو راستیەکانی شاراونەتەوەو پێ شێل کراون ·

کەلی کورد بنەرەتێکی پتەوو سروشتێکی خاوێن‌و باوەرێکی قوولی هەیە ، ئەتوانێت سەر لەنوێ هەلسێتەوەو بوونی ئیسلامی خۆی دیاری بکات‌و دەورێکی کاریگەر لەرووداوەکانی جیهاندا ببینێت ئەگەر چی باری ئێستای نالەبارە ، بەلام سەرزەنشت‌و گلەیی لێ ناکرێت ، دەربارەی ئەم بارە ناهەموارەی کە لەم سەردەمەدا تیایا ئەتلێتەوە لەگەڵ ئەو هەست‌و روانینە تایبەتیەی بەرامبەر ئیسلام‌و گەلانی موسلمانی دەورو بەری هەیەتی ، گلەیی لێ ناکرێت ، چونکە کاتێ ناوی ئیسلام لائەبرێ تەنیا چەند کەسانێکی دروزن‌و خۆپەرست‌و دنیا پەرست نەبێت ، واقیعێکی راستەقینەی ئیسلامی نابینێت ، و کاتێ ناوی عەرەبی لائەبرێ تەنیا سەربازو ئەفسەری خوێن رێژو سی‌خورو پۆلیسی دڵ رەق زیاتر هیچی تری بیر ناکەوێتەوە · پێویستە لەپێشا گلەیی‌و سەرزەنشت ئاراستەی عەرەب‌و گەلانی تری ئەمروێ موسلمان بکرێت وەك تورك‌و فارس · پێویستە ئەو گەلانە لەپێشا دەست لەبانگی نەتەوە گەری‌و جیاوازی خوێن‌و زمان‌و نەژاد هەلگرن · عەرەبەکان پێویستە وتە پیروزەکەی عومەر بهێننەوە یادی خۆیان کە پێیان ئەلێ : ئێوە زەبونترین قەوم بوون ، خوا بەئیسلام پایە بەرزی کردن ئەگەر بەتەمای پایە بەرزی بن لەشتێکی تردا ئەوا خوا رسواتان ئەکات ·

گەلی کوردیش پێویستە ئەوە بزانن کە تەنها لەسایەی ئیسلامدا ئەتوانن بەسەربەرزیو کامەرانی بژینو دەورێکی بالاّ لەرووداوەکانی جیهانیدا ببینن ٠ مێژووی هەزار ساڵەی کورد چاکترین بەڵگەیە لەسەر ئەم راستییە ٠

رووداو و کارەساتە ناخۆشەکانی ئەم سەدەیەو باری ناهەمواری ئێستامان پشتگیری ئەم بۆچوونەمان ئەکەن ٠ بۆ دڵنیا بوون لەم پێویستمان بەلێکۆڵینەوە یەکی مێژووی ئیسلامی کورد هەیە کە لەسەر بنچینەیەکی زانستییانەو لەروانگە ی راستەقینەی ئیسلامەوە دابرێژرێت ٠

" ٢ "

خوای پەروەردگار ئاینی ئیسلامی بۆ کروی ئادەمی بریار داوە ٠ هەر چەندە لەسەرەتاوە لەناو گەلی عەرەبدا دەستی پێ کردوە ، بەلاّم ئەوە ناگەیەنێت کە عەرەب خاسیەتی تایبەتو جیاوازیان لە گەلەکانی تر هەیە ٠ چونکە قورئانی پیروز یەکێتی دروست بوونو بنەچەی مرۆڤایەتی روون کردوتەوە کە ئەڵێت :

" یا ایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شُعوبا وقبائل لتعارفوا، ان اکرمکم عند اللـه اتقاکم ان اللـه علیم خبیر " سورەتی ـ الحجرات ـ ئایەتی ١٣

واتە : ئەی ئادەمییەکان : خوا ئێوەی لەنێرو مێیەك (( ئادەم و حەوا )) دروست کردوەو کردنی بەچەندەها گەلو هۆزەوە بۆ ئەوەی یەکتری بناسنو بە خۆشی پێکەوە بژین ، دڵنیا بن کە چاکترینتان لەلای خوا ئەو کەسەتانە کە زیاتر لەخوا ترسو خواناس بێت ٠ بەراستی خوا زاناو بەئاگای بێ هاوتایە ٠

عەرەب هەروەك گەلانی تری ئەو سەردەمە لەزەنگاوی جاهیلیەتدا ئەتلانەوەو لەهەموو روویەکی ژیانیدا دواکەوتو و گومرا بوون ٠ سەرچاوەی باری ناهەمواری ژیانیان بریتی بوو لەبیر و باوەرێکی بت پەرستیو ماددی بوگەن کەرێکای بیر کردنەوەی خاوێنی لێ گرتبون ٠ عەرەبەکان بەو پەری توندو تیژییەوە دژ ی بانگەوازی ئیسلام راوەستانو بەربەرەکانیان ئەکردو سزاو ئازاری هەڵگرەکانیان ئەدا وەك : بیلالی حەبەشی و موهەیبی رومی و عەمماری کوری یاسر و سومەیەی دایکی کە یەکەم شەهیدی ئیسلامە و بەدەستی ئەبو جەهلی ناپاك ـ کە یەکێکە لە گەورە پیاوانی عەرەب ـ شەهید کرا ،کاتێ لەژێر سزاو ئەشکەنجەدا ئارامی گرتو خۆی بەدەستەوە نەدا ٠

ئەبولەهەب و ئەبوجەهل و وەلیدی کوری موغەیرە و گەلێ لەگەورە پیاوانی تری عەرەب کە نەتەوەگەری و بت پەرستی جاهیلی لەئاستی خۆری روناکی ئیسلام کەرو کوێری کرد بوون ، بەهەموو توانایەکیانەوە بەرهەڵستی ئەم دینە

پاكیان نەكرد . بۆیە ئەتوانین بڵێین : ئەوانەی لەسەرەتاوە باوەڕی خاوێنی ئیسلامیان هەڵگرت ، تەنیا عەرەب نەبوون ... وە ئەگەر عەرەب یەكەم كەس بوو بن كە ئاینی ئیسلامیان هەڵگرتبێ‌و لەپێناویا خەباتیان كرد بێ ، هەر ئەوانیش بوون كە لەسەرەتاوە دژی راوەستاون‌و بەربەرەكانیان كرد .

كەوانە ئیسلام بەرنامەیەكی عەرەبی نی‌یەو بەرهەمێكی نەتەوەیی نیە كە بە كەڵی عەرەبەوە بەسترا بێت . ئەگەر وا بوایە ، ئەوا بەتوندی دژی نەئەوەستان‌و بەرهەڵستیان نەئەكرد . هەروەها ئەگەر بەپەیدا بوویەكی هەرێمایەتی‌و نەتەوەیی دابنرێ ، بەو شێوەی هەڵگرانی تیۆری نەتەوەگەری جاهیلی ئەیانەوێ بەخەڵكی بكەیەنن ، ئەوا هیچ نرخێك بۆ سەرچاوە ئاسمانیەكەی نامێنێتەوە .

بەڵێ پێغەمبەری ئیسلام - درودی خوای لێ بێت - عەرەب بووە ، بەڵام ئەمە نابێتە هۆیەك بۆ عەرەبیتی ئیسلام . چونكە ئیسلام نەبەرهەمی (( محمد )) ە - درودی خوای لێ بێت - وە نەبەرهەمێكی ( عەرەبی )یە . بەڵكو ( محمد ) - درودو سەلامی خوای لێ بێت - پێغەمبەری خوایە وەك پێغەمبەرانی پێشوو . وە ئەگەر پێغەمبەری ئیسلام عەرەب بووە ، ئەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێت كە ئەبولەهەب و ئەبوجەهل‌و وەلیدی كوری موغەیرەش هەر عەرەب بوون . ئەگەر عەرەبیەتی پێغەمبەر هۆیەك بێت بۆ عەرەبیتی ئیسلام ، نەئەبوو پێغەمبەرو ئەبولەهەبی مامی هەڵوێستیان دەربارەی ئیسلام پێچەوانەی یەكتر بوایە .

دانانی ئیسلام لەقالبێكی نەتەوەگەری‌دا ، هەڵقوڵاوی بیرو رایەكی ( عیلمانی ) یانەیە كەدەركەوتنی ئیسلام بەكەڵی عەرەبەوە ئەبەستێت نەك بەناردنی ( وەحی ) لەلایەن خواوە . هەر چەند ئەم بۆ چوونە وا پیشان نادات كەئینكاری وەحی بكات ، بەڵام لەناوەرۆكەكەیدا ئینكاری هەیە . چونكە ئیسلام بە " كەلەپورێكی عەرەبی رووت " دائەنێت‌و كەلەپوریش بەرهەمێكی نەتەوەیی‌یە ، نەك لە ئاسمانەوە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە نێررا بێتە خوارەوە .

ئەم بۆ چوونە جاهیلی‌یە هەر لەسەرەتاوە تێكدانی بنچینەكانی باوەڕی ئیسلامی مەبەستە ، چونكە باوەڕی ئیسلام لەسەر بوونی ( وەحی ) دامەزراوە ، نەك لەسەر بوونی نەتەوەی عەرەب ، لەراستیا لەسایەی ئیسلامدا نەبێت مانای نەتەوەو یەكێتی‌یان هەرگیز نەزانیبوە . لەپێش ئیسلامدا عەرەب بریتی بوون لەچەند هۆزو بەرەیەكی پرژو بڵاو و ناكۆك‌و هەرگیز دوژمنایەتی‌و برا كوژی‌یان لێ نەبراوە .

هەر لەسەرەتاوە لە (( مەككە )) گەلێ ئایەت لەقورئانی پیرۆز هاتوونەتە خوارەوە كە لەگەڵ گروێ ئادەمی‌دا بەگشتی ئەدوێن‌و بەدڵنیایی جیهانێتی دینی ئیسلام ئەسەلمێنن . خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ئەفەرموێت : " وما

**أرسلناك الا رحمة للعالمين** " سورەتی الانبیاء ئایەتی ١٠٧/ واتە : خوای پەروەردگار تۆی ناردوە ـ ئەی پێغەمبەر ـ کە رەحمەت و کامەرانی بیت بۆ هەموو جیهانیەکان . کەواتە ئیسلام بەکەلی عەرەبەوە نەبەستراوە ، بەڵکو بۆ کشت جیهانیەکانە ، بۆیە ئادەمی و هەموو خاوەن ژیریەکانی تریش کە لەم جیهانەدا ئەژین ئەکرێتەوە .

شوێنکەوتووانی تیۆری نەتەوەکەری چی ئەڵێن دەربارەی ئەو رووداوەی کە گەورە پیاوانی قورەیش داوایان لەپێغەمبەر کرد بۆ ئەوەی هەژارو بێ دەسەڵاتەکان لەدەوری خۆی دەربکات وەك صوهەیبی رۆمی و بیلالی حەبەشی و زەیدی کوری حاریسە . گوایە ئەمانە لەبەندەو کۆیلەکانن و ناگونجێت پێکەوە لەسەر ئەم بانگەوازە کۆببنەوە . بەڵام پێغەمبەر بەفەرمانی خوا هیچ گوێی بۆ ئەم داخوازیە بێ جێیە شل نەکردو رووی لەپیاوە ماقوڵانی نەتەوەی عەرەب وەرچەرخان . هەروەها قورئانی پیرۆز هەرەشە ئاراستەی گەلی عەرەب ئەکات ، ئەگەر بێتو پشت لەم دینە هەڵ بکەن ، ئەوا گەلێکی تر ئەخاتە جێگەیان : **" فان تتولوا یستبدل قوما غیرکم ثم لایکونوا امثالکم "** سورەتی محمد /٢٨ ئایا چ تایبەتمەندیەك لەئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بۆ گەلی عەرەب هەیە ؟ ! ئایا چی رووی دا کاتێ عەرەب لەسەردەمی عەباسیەکاندا دەست بەرداری ئیسلام بوون و وازیان لێ هێنا ؟ ! ئایا گەلی تورك و گەلی کورد نەبوون ئاڵایان لەدەست گرتن و جیهانی ئیسلامیان لەچنگ ئەوروپای خاچ پەرست پاراست و رووناکی قورئانیان گەیاندە گەلێ ناوچەی زەوی کەعەرەب هەرگیز پێیان تێ نەخستبو ؟ !

ئاینی ئیسلام بۆ هەموو گەلانە .. بۆ هەموو مرۆڤایەتیە هەتا هەتایە ... ئیسلام کەلەپورێکی عەرەبی نیە تا عەرەبەکان لە ( محمد )ەوە بۆیان مابێتەوە ، چونکە ( محمد ) ـ درودی خوای لێ بێت ـ لەکەسەوە بۆی جێ نەماوە .. بەڵکو لەلایەن خواوە نێرراوە بۆ ئەوەی نەوەی ئادەم ئاگادار بکاتەوەو بانگیان بکات بۆ سەر راستە رێبازی خوایی ... هەموو گەلێك ئەتوانێ لەسەرچاوەی ئیسلام هەڵ بگوزێت و سەرکردایەتی جیهانی پێ بکات و کامەرانی هەر دوو جیهان بەدەست بهێنێت .

مێژونوسەکان بەشێوەیەکی تایبەتی زۆریان دەربارەی دەوری عەرەب لە بڵاو کردنەوەی ئیسلام و گەیاندنی بەجیهان نووسیوە ، بۆ ئەوەی وای بخەنە بەرچاو کەئیسلام دینی عەرەبەو بەس ! لەراستیدا عەرەبەکان هەرچەندە کۆششیان بۆ بڵاو کردنەوەو پاراستنی ئیسلام کرد بێت ، هێشتا هەر کەمە . چونکە بەهۆی ئیسلامەوە بوون بەمیللەتێکی ئەوتۆ کەبتوانن پێشەوایی جیهان بکەن و هەموو گەلانی جیهان حسابیان بۆ بکەن و رێزیان لێ بگرن . هەرچەندە بەتەنها ئەوان نەبوون ، بەڵکو کوردو تورك و فارس و گەلانی تریش بەگشتی بەدرێژایی مێژووی

ئیسلام دەوری باڵایان هەبووەو خەباتی سەختیان کردوە بۆ پاراستنی جیهانی ئیسلام‌و بلاَوکردنەوەی بەرنامە بێ وێنەکەی‌و قوربانی بێ پایانیان لەم بوارەدا بەخشیوە . بۆیە قورئانی پیرۆز روویان تێ ئەکات‌و ئەڵێت : " يمنون عليك ان اسلموا ، قل لاتمنوا علي اسلامكم ، بل الله يمن عليكم ان هداكم للايمان ان كنتم صادقين " سورەتی الحجرات /١٧ . واتە : خوای گەورە روو ئەکاتە پێغەمبەر و ئەڵێت : منەت بارت ئەکەن کە موسڵمان بوون ، تۆیش بڵێ : منەت بارم مەکەن بەموسڵمان بوونتان ، بەڵکو خوا منەت بارتان ئەکات کەری‌نمایی کردوون بۆ ئیمان هێنان ئەگەر ئێوە راست بکەن .

لێرەدا مەبەستمان ئەوە نی‌یە چاو لەو دەورە مێژوویی‌یە دابخەین کە عەرەب پێی هەڵساون بۆ بلاَوکردنەوەی ئیسلام لەجیهاندا ، ئەوانەیان بەراستی‌و دروستی ئالاَی پیرۆزی قورئانیان هەڵگرت ، دوای ئەوەی وازیان لەدەمارگیری‌و رەگەزپەرستی هێناو مەبەستیان تەنیا دامەزراندنی کۆمەڵگەیەکی جیهانی ئیسلامی بوو . بەلاَم لەهەمان کاتا نابێ چاو لەهەوڵ‌و خەباتی گەلەکانی تریش دابخەین وەک :ـ تورک‌و کورد‌و فارس‌و ئەفغان ... هتاد .

لەم پێشەکیەدا ئەمانەوێ پەرچی ئەو میللی گەری‌و رەگەز پەرستی‌یە بدەینەوە کە ئیسلام لەبەر خۆی دائەماڵێت‌و بیری نەفامی بوگەن لەجێگەی ئیسلامی پیرۆز دائەنێت . بەهۆی گومرایی عەرەبەکان لەرێبازی راستی خوایی ، هەموو موسڵمانەکانی جیهانیان لەدەست خۆیان‌دا ، لەپێش هەموویانەوە ، ئەوانەی لەگەڵیانا لەزەوی و ژیانا هاوبەشن ، ئەوانەی بەدرێژایی مێژو بۆ ئیسلام ژیاون وەک گەلی کورد .

بۆ ئەو ئوممەتە قورئانی‌یە مەزنەی کە لەکوردو تورک‌و عەرەب‌و فارس‌و ئەفغان ... هتد پێک هاتوەو ئیسلام بەنەژادو نیشتمان‌و نەتەوەو ئامانج دائەنێن ... بۆ ئەمانە هەموو ئەم باسە ئەنووسین .. بەتایبەتی بۆ گەلی کوردی ستەم لێکراو . لەخوای گەورە ئومێدەوارین لەتاریکستانی نەزانی‌و نەفامی رزگاریان بکات‌و رێ نمایی‌یان بکات بۆ سەر رێبازە راستەقینەکەی قورئان ، بەهیوای هەڵکەوتنی زانای پایە بەرزی تری وەک (( ئیبن صلاح شارەزوری )) و فەرماندەی مەزنتری وەک (( صلاح‌الدين )) ...

"٣"

وەک لەپێشەوە ووتمان ، پێویستە مێژووی ئیسلام سەر لەنوێ بەپێی تێروانینی ئیسلامی بنوسرێتەوە ، وە ئەبێ بەتەواوی لەو دەست کاری کردن‌و گۆرانکاریانە پاک بکرێتەوە کە نێرراوانی ئاینی‌و رۆژهەلات ناسانی ئەوروپایی گاور تیایا

کردویانە بۆ ئەوەی بیخەنە قالبێکی نەتەوە گەری‌یەوە بۆ هێنانە دی مەبەست‌و ئاواتی گڵاویان لەپەرتەوازە کردنی مێژووی ئیسلامی بۆ چەند مێژوویەکی نەتەوە گەری‌و هەرێمایەتی کە هیچ پەیوەستیێکی گیانی لەنێوانیاندا نەبێت - واتە بیکەنە مێژووی عەرەب‌و مێژووی کوردو مێژووی تورك ... هتد .

لەم رێگایەوە ئیسلامیش پەرت پەرت بکەن بۆ ئیسلامی عەرەبی‌و ئیسلامی تورکی‌و ئیسلامی فارسی‌و ... هتد . بەم شێوەیە ئامانجی خۆیان بهێننە دی لە جێگیر کردنی بیرو رای نەتەوە گەری لەدڵ‌و دەروونی موسڵمانەکاندا بە گشتی‌و کەرت کەرتیان بکەن بۆ چەند بەشێکی نەتەوەیی کە چەندەها بەربەستی دەرونی‌و هەرێمایەتی‌و رەگەز پەرستی لەنێوانیاندا دروست ببێت ، وەك پێشەکیەك بۆ ئیمپریالیستی فیکری کە راستەوخۆ ئیمپریالیستی سەربازی بەدوایا دێت ، بەو شێوەیەی لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بەسەر جیهانی ئیسلامدا هات . بیرو رای چەپەڵی نەتەوە گەری لەلایەن تورکەکان‌و عەرەبەکانەوە بوویە هۆی روخانندنی دەوڵەتی ئیسلامی عوسمانی . ئیمپریالیستی خاچ پەرستی نوێ لەئینگلیزی‌و هۆڵەندی‌و فەرەنسی‌و ئیتالی‌و ئیسپانی‌و رووسی توانیان جیهانی ئیسلام لەنێوان خۆیاندا دابەش بکەن‌و هەر لایەکیان قەپی لەچەند پارچەیەك گرت وەك میراتێ بێت کە لەباب‌و باپیریانەوە بۆیان جێ مابێت .

دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکان بەهەموو توانایەکیانەوە نەخشەیان دارێژرا بۆ پەرتەوازە کردنی ئەو گەلانەی لەسایەی ئیسلامدا پێکەوە ئەژیان‌و لەپێناویا قوربانیان‌ئەداو دژی دوژمنانی ئەجەنگان . پەراوەکانی مێژووی ئەم سەردەمە هیچ بایەخێکیان بە روونکردنەوەی دەوری ئەو گەلانە نەداوە کە بەدرێژایی مێژوو بۆ ئیسلام ژیاون ، بەڵام بەتەنیا هەر دەربارەی گەلی عەرەبیان نووسیوە هەروەك مێژووی ئیسلام بریتی بێت لەمێژووی عەرەب‌و بەس . خۆ ئەگەر شتێکی کەمیش نوسرا بێت ، ئەوا بەشێوازێکی نارێك‌و ناشیاو نوسراوە کە جگە لەرق‌و کینەو بیری میللی گەری هیچی تر نابەخشێت - بۆ نموونە پەراوەکانی مێژووی نوێ دەوڵەتی ئیسلامی عوسمانی بەئیمپریالیزمی تورکی ناو ئەبەن‌و بەپێشەوای سیاسەتی تەتریکی دائەنێن ، کە لەراستی‌دا " موستەفا کەمال ئەتاتورك " پێشەوای ئەم ئاڵوگۆڕی‌یە بوو کە دەوڵەتە ئیمپریالیزمیەکان دەرهێنەری بوون .

ئەم فس فس پاڵەوانە یەکێك بوو لەئەندامانی پارتی " ئیتیحادو تەرەقی " کە ئاڵای میللی گەری تورانی‌یان هەڵکردبوو - دامەزرێنەرانی ئەم پارتە لەجوولەکە (( سلانیك )) بوون لەیوگسلافیاو بەجوولەکەی (( دونمە )) ئەناسران . بەرواڵەت وایان پیشان دابوو کە موسڵمان بوون ، بەڵام لەراستی‌دا هەر جوولەکە بوون‌و

ماسۆنیەتی جیهانی هەڵی بژاردبوون بۆ بەجێ هێنانی نەخشەی گڵاوی ئیمپریالیزم لەناو جەرگەی جیهانی ئیسلامیدا (١).

دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێکی ئیسلامی بوو کە ماوەی نۆ سەدە ئاڵای ئیسلامی هەڵکردبوو. بەڵام لاوازیو کەمتەرخەمی هەندێ لەسوڵتانەکانو کاربەدەستانودەستی چەپەڵی ماسۆنیەت دەورێکی باڵایان نواند لەلاواز کردنو پێ شێل کردنو گۆڕانی رووی راستەقینەی ئەم دەوڵەتەدا. ماسۆنیەت بەهۆی داموو دەزگاو کۆمەڵە پیاوەکانیەوە کە لەسەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا جێگەی خۆیان کردبوەوەو لە سەر حسابی ماسۆنیەت ئیشیان ئەکرد، توانیان شێوەیەکی ناهەموار لە نـاو موسڵمانەکاندا بۆ ئەم دەوڵەتە دروست بکەن، بەرادەیەك مرۆڤ شەرم بکـات کە بەدەوڵەتێکی ئیسلامی دابنێت.

بۆ نموونە لەگشت پەراوەکانی مێژودا (سوڵتان عبدالحمید)یان وا داوەتە قەڵەم کە پیاوێکی زاڵمو خوێن رێژو بێ ویژدان بووەو تەنها خەریکی رابواردن و یاری کردن بووە لەگەڵ کەنیزەکو ئافرەتاندا. بەڵام لەراستیدا ئەم سوڵتانە زۆر دوور بووە لەم جۆرە رەوشتانەو بگرە لەزۆربەی سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی چاکتر خواناس‌تر بووەو زیاتر هەوڵی داوە جیهانی ئیسلام لەچنگی گاورو جوولەکە و دوژمنانی بپارێزێت. بەڵام بەداخەوە لەسەردەمێکی زۆر ناهەمواردا فەرمانرەوایی گرتە دەست. دوژمنان لەهەموو لایەکەوە تەنگیان پێ هەڵ چنی بوو، بەرادەیەك بواریان نەئەدا کارو بار راست بکاتەوە. پیلانێکیان رێکخستو بەهۆی پارتی ئیتحادو تەرەقی ماسۆنیەوە توانیان لەسەر تەختی خیلافەت لای بەرن، بۆ ئەوەی هیچ کۆسپێك لەبەردەم دوژمنانی ئیسلامدا نەمێنێت بۆ بەجێ هێنانی نەخشەی ترسناکیان بۆ دابەش کردنی جیهانی ئیسلامو لەناو بردنی ئاینی ئیسلام.

هەڵگرانی بیری نەتەوە گەری عەرەبی دەورێکی ناپاکیان لەم تێکـدانو گۆڕانەدا گێڕا. چونکە زۆربەی پێشەوایانی ئەم بیرە جاهیلیەتە گاور بوون و بۆ حسابی ماسۆنیەتی جیهانی ئیشیان ئەکردو لەقوتابخانەکانی ((تەبشیر))دا پەروەردە کرا بوون کە لەشام و میسرو سودان‌دا بۆ ئەم مەبەستە بنیات نرابوونو لەدەرگایەکی لەبار بوون بۆ چالاکیەکانی خاچ پەرستیو ماسۆنیەت دژی ئیسلام.

---

(١) بۆ دڵنیا بوون لەم راستیانەو ژیانی ((کمال ئەتاتورك))بەدرێژی تەماشای کتێبی ((الرجل الصنم))بکە دانراوی ئەفسەرێکی تورکیە.

مێژوی ئیسلامی کوردیش تووشی ناهەموارترین کرداری گۆڕانو تێکدانو پشت گوێ خستن هاتووە . عەرەبی موسڵمان هیچ شتێك دەربارەی برایانی کوردی موسڵمانی نازانێت کەمەڵبەندی چیاکاندا بەدرێژایی مێژووی پر لەرووداو ، کارەسات خەباتیان کردوەو لەگەڵ گەلانی تری موسڵماندا بەو پەری ئازایەتیو جوامێری‌یەوە بەشداریان کردوە بۆ پاراستنی ئیسلام بەربەرەکانی کردن دژی دوژمنانی خوا . بگرە کور ، ی موسڵمان خۆیشی هیچ شتێك دەربارەی مێژوی ئیسلامو مێژوی ئیسلامی کـــورد بەتایبەتی نازانێت !

ئەم نەزانینە دەربارەی رووداوەکانی مێژووی ئیسلامی ، هۆیەکی سەرەکیـــــە بۆ لاواز بوونی پەیوەندیٔ موسڵمانەکان بەدینەکەیانەوە هەروەها بەیەکترەوە لــەم سەردەمەدا . جگە لەزاڵ بوونی بیرو رای میللی گەری بەسەر راقە کردنی مێژوی ئیسلامی‌دا کەبووەتە هۆی جیا کردنەوەی گەلانی موسڵمان بەتەواوی لەمافـــــی زانینی پلەو پایەی سروشتی خۆیان لەمێژووی ئیسلامیو رووداوەکانیا بەکوێـر ە ی ئەو دەورەی دیویانە لەدروست کردنو گەشە پێ دانو پاراستنی ئەم مێـــــژووە پرشنگدارەدا کەشانازی پێوە ئەکەین ٔوەك چۆن شانازی بەئیسلام خۆیەوە ئەکەین .

وەکو ووتمان مێژووی ئیسلامی بەتەنها مێژووی عەرەب نیە ، هەروەها مێـــژووی عەرەب مێژووی ئیسلام نیە بەگشتی . چونکە گەلەکانی تریش لەدروست کـــردنو دارشتنی ئەم مێژوەدا بەشداریان کردوە . بێگومان مێژوی ئیسلامی ئەم گەلانــــە لەگەڵ مێژووی ئیسلامی عەرەب‌دا ، ئینجا رووبەری سروشتیو تەواوی رووداوەکانی مێژووی ئیسلامی پێك ئەهێنن .

گەلی کورد ئیسلامیان پاراستووەو دژی ئیستعماری خاچ پەرستی خەباتیـــــان کردوە کەدرندەترین دوژمنی مێژویی ئیسلامن ، لەکاتێکا پاڵەوانی کوردی موسڵمان (( صلاح‌الدینی ئەیوبی )) سەرکردایەتی خەباتی گرتە دەست بۆ پاراستنـــــــی نیشتمانی ئیسلامی ، کە بەپێی تیروانینی قورئانی بریتیە لەنیشتمانو شناسنامەی هەموو موسڵمانێك . نیشتمانی ئیسلامی بەتایبەتی بەکەسەوە نەبەستراوە ، بەڵکو نیشتمانی خۆشەویستی گشت موسڵمانێکە لەهەر کوێ‌یەك بێت وە لەهەر کاتێکا بێت بەمەرجێ ئاڵای (( لا الــه الا الــلــه محـمـد رسول الـلــه )) بەسەریـــا بشەکێتەوە .

ئیسلام زۆر چاك کوردەکانی تێگەیاند بوو کەنیشتمانو شناسنامەو باوەرو مایەی گشت شانازیەکیان تەنها ئیسلامو خەباتکردنە لەپێناوی پاراستنو بەرز کردنەوەی ئاڵاکەیدا . ئەگینا چۆن تێکۆشانو قوربانی دانیان بۆ رزگار کردنی قودسی پیرۆز

راقە بکەین • هەروەها گرنگی دانیان بەزمانی عەرەبی لەکاتێکا خۆیان زمـــان و نیشتمانی تایبەتیان هەیەو شانازی پێوە ئەکەن ؟ ! بێگومان خۆشەویستی ئیسـلام پاڵی پێوە ناون بۆ ئەم ئامانجە پیرۆزە ! !

" "

گەلی کورد بەباوەڕێکی پتەو و سنگێکی فراوانەوە ئاینی ئیسلامیان وەرگرتوەو بەخێرایی لەگەڵیا گونجاون • چونکە ئیسلام بریتی‌یە لەوەڵامدانەوەی سروشتی بۆ ئەو دەروونە خاوێن‌و خێر خوازەی لەقوڵایی فیطرەتیاندا جێگیر بووە ، بەهۆی ئەو سروشتە جوان‌و سازگارەوە خوای پەروەردگار پێی بەخشیوون • لەچیاو دوڵـــــی رەنگین‌و بەفرینی کوردستاندا • بۆیە کوردەکان بەگشتی ئیسلامیان وەرگرتـــوەو راستەوخۆ دەستیان داوەتە تێکۆشان لەپێناویاو لەپاشا توانیان سەرکردایەتــــی جیهانی ئیسلام بگرنە دەست بۆ خەبات کردن دژی دوژمنانی داگیرکەر • ئـــەم راستی‌یە چاکترین بەڵگەیە لەسەر پاکی‌و ئازایەتی‌و رەوشت جوانی ئەم میللەتـــە کەهەمیشە ئامادەن بۆ وەرگرتنی راستی‌و بەرهەڵستی کردنی نارەوایی •

وەکو ووتمان گەلی کورد وەنەبێ تەنها ئیسلامیان وەرگرتبێ‌و بەس ، بەڵکـــو خەباتیان کردوە بۆ بڵاو کردنەوەی بانگەوازەکەی لەهەموو ناوچەکانی دوورو نزیکی ئەم جیهانەداو لەگەڵ موسڵمانانی عەرەب‌و تورکدا بەشداریان کردوە بۆ رزگـــار کردنی ئاسیای بچووک‌و ئەورووپای خۆرهەڵات لەچنگی خوانەناسان‌و بێ باوەڕان • هەر ئەمانیش بوون جیهانی ئیسلامیان‌لەزۆرو ستەمی خاچ پەرستانی ئەورووپــا ی خۆرئاوا رزگار کردو دەوڵەتێکیان دامەزراند کەبووە بەردی بناغە بۆ فراوانکردنــی زەوی ئیسلام لەگشت لایەکەوە • وەهەر لەسەر دەستی کوردەکاندا بوو کەدوا قەڵای شعوبیەت روخێنرا کەبریتی بوو لەدەوڵەتی ئیسماعیلیە لەمیسر • هەروەها کوردەکان توانیان دەسەڵاتی سەربازی لەباکووری ئەفەریقادا جێگیر بکەن‌و قەڵاکـــا ن دژی دەوڵەتی رۆمانی قایم بکەن • بەم شێوەیە سنوری دەوڵەتی ئیسلامیان پاراست‌و قودسی پیرۆزیان لەچنگی خاچ پەرستەکان رزگار کرد • دەرکەوتنی (( صلاح‌الدین )) لەو سەردەمەدا بوو بەهۆی گۆرانی مێژوی ئیسلام بەتایبەتی‌و مێژوی جیهـــــان بەگشتی • چونکە دەوڵەتی عەباسی لەسەرە مەرگا بوو ، دوژمنان خۆیان بۆ سەلاس دابوو بۆ پەلامار دانی‌و لەناو بردنی‌و دابەش کردنی لەنێوان خۆیاندا • وە هـــەر ئەم رووداوەش بوو کە بوو بەهۆی ژیاندنەوەی ئەورووپا لەتاریکی نەزانـــــــی‌و بەندایەتی‌و گەیشتە ئەم ئاسۆیەی کەئێستا تیایا ئەژی !

بێگومان زۆر لایەنی تری مێژووی ئیسلامی کورد شاراوەیەو پێویستی بەئاشکرا

کردن‌و نوسینەوەو بلاوکردنەوە هەیە ٠ مێژوی ئەم میللەتە خەباتکەرە بەشێکە لە مێژوی ئیسلامی‌و لێی جیا ناکرێتەوەو شانازیشی پێوە ئەکەین، چونکە باوەڕەکەمان دروستی کردووە ،و هەر ئەم باوەڕەیە کە بریتی‌یە لەپەیوەندی فیکری‌و ڕوحـــی‌و ویژدانی‌و ئیمان بەستێت بەگەلانی تری موسڵمانەوە ٠ زیاتر لەوەش ئەم مێــژووە مەزنە بریەتی لەپاڵەوانێتی‌و ئازایەتی‌و هەڵوێستی پڕ لەشانازی کەمێژو بۆباب‌و باپیرانمان تۆمار کردووە ٠

ئیسلام پەیوەندی هاوبەش‌و گەورەترین ڕاستی‌یە کە موسڵمانەکان بەگشتی لــە عەرەب‌وفارس‌و کوردو تورك ٠٠٠ هتد بەیەکەوە ئەبەستێت، کۆمەڵگەی ئیسلامــی پێك ئەهێنن ٠ لەم کۆمەڵگەیەدا هیچ جیاوازیەك لەنێوان کوردو عەرەب‌و کەسێکی تردا نیە ،جگە لەپلەی پەرستن‌و خەبات کردن ٠ ئەندامەکانی ئەم کۆمەڵگەیـــە هەمو وەك دانەکانی شانە ڕێك‌و یەکسانن‌و هەمویان نەوەی (( ئادەم ))ن و ((ئادەم )) یش لەخاکی ئەم زەوی‌یەیەو خوای پەروەردگار ڕێزی لێ ناوە ٠

" ٦ "

گەلی کورد لەبزوتنەوەی فیکری‌و بنیات نانی شارستانێتی‌یە مەزنەکـــــەی ئیسلامدا بەشداری کردوە ٠ ئەم بەشداری کردنەش بەزوری لەبواری زانیاریەکانــی شەریعەتی ئیسلامی‌و قورئان‌و حەدیس‌دا بووە ،ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزی‌و قوولی باوەڕەکەیان ٠ لەزانیاری حەدیسدا پێشەوا بوون بەبێ هاوشان بۆ نموونە : ( ابن صلاح شارەزوری ) کە بەناوبانگترین زانایە لەزانیاری حەدیسدا کوردە ٠

هەروەها گەلی کورد لەبلاو کردنەوەو گەشە پێدانی زانیاریە شەرعیەکانـــدا هاوکاری کردوە ٠ سەدان بەرگ کتێب لەزانیاریەکانی فیقهی ئیسلامیدا بەنـــاوی زانایانی کورد ڕازاونەتەوە ،وەك (( ئامدی )) کەخاوەنی کتێبی " الاحكام في اصول الاحكام"ە ٠ هەروەها لەزانیارەکانی مێژو جوگرافیاو ئەدەب‌دا گەلێ زانـــــای بەناوبانگیان لێ هەڵکەوتوە کەمایەی شانازی‌و سەربەرزین ،وەك زاناو مێژونوسی ناودار (( ابن الاثير ))کە خاوەنی کتێبی (( الكامل في التاريخ ))ە یان (( ابن خلكان )) مێژو نوس‌و جوگرافی ناسی بەناوبانگ کە بەرهەمەکانیان وەك ئەستێرە لەئاسمانی مێژوی ئیسلامیدا ئەدرەوشێتەوە ٠ ئەمانەو دەیان زانای تر کە بەهۆی نەزانی پشت گوێ خستنەوە ناویان شاراوەتەوەو لەبیر براونەتەوە ٠

پێویستە مێژو نوسە موسڵمانەکان قوڵی لێ هەڵ بماڵن بۆ ئەوەی ڕاستی‌یەکانی مێژوی ئیسلامی زیندو بکەنەوەو ئەو گەردو تۆزو ژنگەی لێ نیشتووە لای بــەن و ڕووە پرشنگدارەکەی ئاشکرا بکەن ٠ پێویستە بایەخێکی تەواو بەم مێژوە بدرێت

چونکە گەلێ لایەنی شاراوەی شارستانێتی ئیسلام زیندو ئەکاتەوەو زیاتر نەوەکانی پێکەوە ئەبەستێت .

بزوتنەوەی فیکری لەلای گەلی کورد بەرهەمێکی شارستانێتی ئیسلامییە کە لەبنیات نانیدا هاوکاریان کردوە ٠کەواتە گەلی کورد گەلێکی ئەخۆر نین کە بنەرمەتو شارستانێتی‌یان نەبێت ،وەك هەندێ نەفامو نەزان لێی تێ ئەگەن٠ بەڵکو گەلێکی خاوەن نەژادو مێژوەو بەشانازیەوە جێگەی خۆی لەریزی گەورەترین شارستانێتی‌دا دیاری کردوە ،ئەوەش شارستانێتی ئیسلامی‌یە کە گەورەترین بەشی زەوی گرتوتەوە لەنێوان ئاسیاو ئەفەریقیاو ئەوروپادا ٠بە ئەم ناوچە فراوانە ئەوترێ جیهانی ئیسلامی ،کەنیشتمانی هەر ئەو کەسانەیە تیایا ئەژین‌و بیروباوەری ئیسلامیان هەڵگرتووە ٠ئەمەیە واتەی هاونیشتمانێتی لەتێروانینی ئیسلامیدا ،کە لەدڵو دەروون‌و مێشکی گشت موسڵمانێکدا جێگیرە لەتورك‌و کوردو فارس‌و عەرەب‌و ئەفغان‌و ٠٠ هتد ٠لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا رەگەزو دەمارگیری و میللی گەری‌و رەنگو زمان ناخوێنرێتەوە ٠ بەڵکو چاکترین‌و تاقە شناسنامە کە ئەندامێکی ئەم کۆمەڵگەیە پێش کەشی بکات بریتی‌یە لەدڵسۆزی‌و خەبات کردن‌و رەوشت جوانی‌و باوەری پتەوە ٠ئیتر لەهەر هۆزو گەڵو زمان‌و رەنگێك بێت ،یا پێست رەشەکانی خواروی ئەفەریقیاش بێت ٠ هەر کەسێك لەم راستە رێبازە لابدات ،ئەوا سوك‌و ریسواو لەریز بەدەرە ،ئەگەر بێت‌و عەرەبیش بێت‌و لەنەوەی پێغەمبەریش بێت !٠

x x x

" ٧ "

دوای ئەوەی دەوڵەتی ئیسلامی کورد دامەزراو لەجەنگی بەناوبانگی ( حەتین )دا بەفەرماندەی (( صلاح‌الدین )) زۆرانێکی سەربازی‌و دەروونی بەسەر ئەوروپای خاچ پەرستا هێنا ،چەند دووریەکی گرنگ لەبوونی مێژوی گەلی کوردا پەیدا بوو ، دەربارەی کاریگەری ئەم میللەتە لەرووداوەکانی مێژودا ٠ئەمە راستی‌یەکەو واقیع ئەی سەلمێنێت‌و دەم کوتی گشت نالەبارێك ئەکات کەنمیەوێت دان بەمافی مێژویی ئەم گەلە قارەمانەدا بنێت ٠ بێگومان جەنگی خاچ پەرستەکان بەرای گشت مێژو نووسەکانی رۆژهەڵاتی‌و رۆژئاوایی ،هۆیەکی کاریگەرو سەرەکیە لەبوژاندنەوەی ئەوروپاو رووخاندنی دەرەبەگایەتی‌و دامەزراندنی حکومەتە میللی‌یەکان‌و بەرپابوونی شۆرشی پیشەسازی‌دا ٠ هەروەها ئەوروپا هەرگیز تاڵی‌و دژواری ئەو دۆرانندنە مێژووییەی لەبیر نەچۆتەوە کە لەسەر دەستی موسڵمانەکاندا چەشتویەتی بەسەرکردایەتی کوردەکان ٠

عەرەبەکان لەپێش هەموو کەسێکەوە گوێیان لێ بوو (( ژەنەراڵ ئەلەنبی )) فەرماندەی هێزەکانی بەریتانیا ،کاتێ هاتە فەلەستین‌و بەزۆری ئاگرو ئاسن ئەو ناوچەیەی داگیر کردو ڕۆیشتە سەر گۆڕی پیرۆزی (( صلاح‌الدین )) و ووتی : من لەنەوەی خاچ پەرستەکانم‌و شارلانم ،ئەی صلاح‌الدین نەوەکانی تۆ لەکوێن ؟ ! ئینجا ووتی : ئەمڕۆ جەنگی خاچ پەرستی دوایی هات ! بەڵام ئایا ڕاستە دوایی هاتووە ؟ !

ئەم ڕاستی‌یە کەمێژووی نوێ تۆماری کردوە چاکترین بەڵگەیە لەسەر کاریگەیی ئەو دۆرانندنە مێژوویی‌یەی بەسەر ئەوروپای ڕۆژئاوادا هات ،کاتێك خاچ لەبەردەم هیلالدا شۆڕ کرایەوە . کەواتە گەلی کورد کێشەو پلەی تایبەتی خۆی لەمێژووی ئیسلامی‌و مێژووی مرۆڤایەتی‌دا هەیە . ئەی ئێستا چی ڕووی داوە ؟بۆچی بەم شێوەیە بەرکەنار کراوەو جیا کراوەتەوە ؟ وە بۆچی لەلایەن عەرەب‌و تورك لەو فارسەوە ئەم دژایەتیە میللی گەریەی لەگەڵدا ئەکرێت ؟ لەکاتێکا هەموو ڕۆڵەی هەمان ئوممەت‌و قوتابی هەمان پەراون کە قورئانی پیرۆزە ؟ وە بۆچی ئەم تەوقە ترسناکە خوێناویەی کراوەتە گەردن ؟ ! بەمەرجێك هەمیشە بەگیان‌و ماڵ ڕۆڵەکانیەوە ئامادە بووەو ئامادەشە بۆ ڕزگار کردنی قودس‌و هەموو ناوچە داگیر کراوەکانی تری جیهانی ئیسلام .

ئەم ناکۆکی‌یە خوێناویە کاتێك دروست بوو کە تورك‌و عەرەب لەبرایی باوەر دەرچوون‌و وردە وردە لەئیسلام دوور کەوتنەوە بەهۆی زیندوو کردنەوەی مێژووی جاهیلی میللی گەری‌یەوە . بەم ڕێگایەش دوو ئامانجی گڵاوی بێگانەکانیان هێنایە دی :

یەکەم : دروستکردنی تورکایەتی‌و عەرەبایەتیەکی لەئیسلام داماڵراو .

دووەم : داماڵینی مێژووی ئیسلام لەئیسلام‌و دانانی مێژوویەکی عەرەبی میللی گەری رووت کەهیچ پەیوەستیەکی بەگەلانی تری موسڵمانەوە نەبێت ،مەگەر بەشێوەیەك خزمەتی شەخسیەت‌و مێژووی عەرەبی بکات . لەپاشا دەستیان دایە بەعەرەب دانە قەڵەمی هەموو زاناو پیاوە مەزنەکانی ئیسلام کە لەگەلانی تری موسڵمانن ،گوایە ئەمانە بەزمانی عەرەبی بەرهەمەکانیان تۆمار کردوە . تا بەم مەنتیقە ناهەموارە ،شوێنکەوتوانی جاهیلیەتی عەرەبی ئەیانەوێت گەلی کوردو گەلانی تری موسڵمان لەئیسلام دوور بخەنەوە . بێگومان نەخشەی ترسناك بۆ ئەم مەبەستە کێشراوە لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە لەخاچ پەرستان‌و ماسۆنیەکان‌و سەهیۆنیستەکان .

" ٨ "

دوژمنانی ئیسلام لەتاریکاییدا دەستیان بەنەخشە کێشان کرد بۆ کپ کردنەوەو کوژاندنەوەی بڵێسە پرشنگدارەکەی ئیسلام دوای ئەوەی بەرەی سەندو تینی پەیدا کردو دۆرانێکی تری سەربازیو دەروونی بەسەر ئەورووپای رۆژئاوای هێنا ،کاتێک لەسەر دەستی (( سولتان محمدی فاتیح )) دا شاری ( قوستەنتینیە ) رزگار کراو کرا بەپایەتەختی دەوڵەتە فراوانەکەی ئیسلام . دەوڵەتی ئیسلام فراوان بوو و باڵی بەسەر گەلێ ناوچەی ئەورووپادا کێشا چونکە جیهاد ریبازی بەردەوام بوون و هۆی مانەوەی ئەم دەوڵەتە مەزنە بوو . ئەمە لەلایەکەوە هەروەها کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵگەیەکی جیهانییەو لەبۆتەکەیدا هەموو گەلۆ نەتەوەکان پێکەوە ئەژیــن بەهۆی باوەری بەتینی ئەم دینەوە .

بیری فراوان کردن و رزگار کردنی ـ فتح ـ ئیسلامی خولیای شەو و رۆژی سوڵتانەکانی عوسمانی بوو ،بەتایبەتی لەناو جەرگەی ئەورووپادا . چونکە ئەورووپـــای رۆژهەڵاتیان بەتەواوی لەچنگی خوانەناسیو نەفامی رزگار کرد بوو ،بریسکەی ناڵی ئەسپەکانیان قەڵای پاشاکانی ئەورووپای هێنا بووە لەرزین . بۆیە دەوڵەتـــــە ئەورووپاییەکان هەموو لەسەر ئەوە رێکەوتن دەوڵەتی عوسمانی لەناو بەرن کە تاکە کۆسپ بوو لەرێگەیاندا بۆ زەوت و کردن و تاڵان کردنی سامان و بەروبوومــــی رۆژهەڵاتی ئیسلامی . وە بەپێویستیان ئەزانی کەبینای ئەم دەوڵەتە تێك بدەن و ئاڵای خیلافەتی ئیسلامی لەسەر شانۆی ژیان داگرنە خوارەوە .

دوژمنانی ئیسلام چاك دڵنیا بوون کەئیسلام نهێنی هێزو مانەوەی ئـــەم دەوڵەتەیە . لۆرد کرۆمەر کە مەندوبی سامی بەریتانی بوو لەقاهیرە لەو سەردەمەدا رووی کردۆتە ئینگلیزەکان و ووتویەتی : تا ئەم قورئانە بخوێنرێتەوەو کەعبـــە زیارەت بکرێت ،ئێوە ناتوانن کارو باری خۆتان لەم ناوچەیەدا جێگیر بکەن .

ماسۆنیەت و خاچ پەرستی جیهانی پێکەوە نەخشەیان کێشا بۆ لاواز کــردن و روخاندنی ئەم دەوڵەتە ،بەهۆی بالیوزخانەکانیەوە لەئەستەمبول و شارە گەورەکانی تری ئیسلامدا . تۆرەکانی داوی ( تەبشیر ) لەهەموو لایەکی جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بوونەوەو دەستیان کرد بەگومان دروستکردن بەرامبەر ئیسلام و بوونی خواو شەخسیەتی پێغەمبەرو خەلیفەکان و پێشەوایانی تری ئیسلام . سوودیان لـــەو نەزانیو نەخوێندەوارییە وەرگرن کە لەزۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامـــیدا تەشەنەی کرد بوو ،بەهۆی کەمتەرخەمیو بێئاگاییو گومرایی زۆربەی کاربەدەستانی دەوڵەتەوە . بەمەشەوە نەوەستان ،بەڵکو رۆژهەڵات ناسەکانیش دەستیان کرد بە نووسینەوەی مێژووی ئیسلام و زیندو کردنەوەی مێژووی جاهیلی عەرەب و گەلانـــی

تری ئیسلامو بەرگی نەتەوە گەرییان لێ پۆشیو کردیان بەیەکەم هەنگاو بــۆ مراندنی گیانی ئیسلامیو چاندنی تۆوی نەتەوە گەریو رەگەز پەرستی لەجیهانیدا، بەتایبەتی لەناو تورکو عەرەبەکاندا .

جوولەکەکانیش لەرێگای دەزگاکانی ماسۆنیتی‌یەوە دەورێکی بالایان بینی لــە لاواز کردنو روخاندنی دەوڵەتی عوسمانی‌دا . ئەوە بوو بەهۆی پارتی ئیتحــاد و تەرەقی تورانی‌یەوە توانیان سوڵتان عبدالحمید لەسەر تەختی خیلافەت لابــەن کە گەورەترین کۆسپ بوو لەرێگەی زایۆنی جیهانیدا بۆ دابین کردنی پارچەیەك زەوی لەناو جەرگەی وولاتی ئیسلامیدا لەفەلەستین .

( قەرەصۆ ) سەرۆکی بنەماڵەی جوولەکەکان لەدەوڵەتی عوسمانیدا ، چــــوە لای ( سوڵتان عبدالحمید ) بۆ وەرگرتنی پارچەیەك زەوی لەفەلەستین بەرامبەر ( ۲۰ ) ملیۆن لیرەی زێری پوخت ، لەکاتێکا گەنجینەی دەوڵەت لەوپەری نابووتی‌دا بوو. بەڵام خوای میهرەبان پاداشتی ئەم سوڵتانە مەزنە بداتەوە رووی کردە ( قەرەصۆ ) ووتی : ئەی بەراز ، زەوییەك بەخوێنی موسڵمانان ئاو درا بێت ، تا خوێنمانــی لەسەر نەرژێت نایدەم بەدەست ئەم چەپەڵانەوەو هەرگیز مێژوی باو باپیرم گڵاو ناکەمو ئەمە زەوی ئیسلامەو هەر ئەبێ بمێنێتەوە ) .

لەمێژوی نوێ‌دا نەمان بیستوە کەهیچ سەرۆکێکی عەرەبی هەڵوێستێکـــــــی قارەمانانەی بەرامبەر بەمەسەلەی فەلەستین بوو بێت ، وەك هەڵوێستی ئـــــەم سوڵتانە مەزنە یان وەك هەڵوێستی صلاح‌الدین کەلێیان پرسی : ئایا هۆی چیــە هەرگیز پێکەنینت لەدەم دەرناچێت ؟ لەوەڵامدا ووتی : چۆن ئەتوانم پێبکەنـــمو قودسی پیرۆز لەژێر دەستی خاچ پەرستەکاندا بنالێنێت !

خۆ ئەمرۆ بەچاوی ئەبینین کەسەرۆکە ئەڵقە لەگوێکانی نەتەوە گەری عەرەبــی چۆن فەلەستینو ناوچەکانی تر بەنرخێکی هەرزان ئەفرۆشنو پێش کەشی دوژمنانی ئەکەنو سوکیو رسوایی دنیاو قیامەت بەسەر خۆیاندا ئەهێنن .

دوای لابردنی سوڵتان عبدالحمید ، هێزە جیهانیەکانی بە بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو روسیاو ئەمریکاوە توانیان پەلاماری دەوڵەتی عوسمانی بدەنو لەجەنگــی جیهانی یەکەمدا روخاندیانو ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیان لەنێوان خۆیانـــــدا دابەش کرد . بۆ ئەوەی زیاتر نەخشەی گڵاوی خۆیان بەجێبهێننو رقو کینــەی هەزار ساڵەیان دابمرکێننەوە ، لەناو جەرگەی وولاتی ئیسلامدا لەتورکیا فس فــس پاڵەوانێکیان لەسەر تەخت داناو بەرگێکی قارەمانانەیان لەبەر کرد کە گوایە ئەم فەرماندە خەباتکەرە ( کمال ئەتاتورك ) توانی تورکیا بەدەستەوە نەداو بــە ســـەر دوژمنانـــدا زاڵ بێت . ئینجا بۆ ئەوەی زیاتر نەخشەکەیان سەرکەوتوو بێـــت ،

هاتن هەموو پێکەوە پەیمانی ( لۆزان )یان لەنێوان تورکیاو دەوڵەتە ئەوروپاییەکاندا بەست . لەم پەیمانەدا بتی داتاشراوی نەتەوە گەری تورکیا ( کمال ئەتاتورك ) بەڵێنیدا بەتەواوی شوێنەواری ئیسلامیەت لەتورکیادا نەهێڵێت . بۆ ئەم مەبەستە رووپۆشی ئافرەت و بەرگی نەتەوەیی ـ بەتایبەتی بۆ زانایانی ئیسلام ـ قەدەغە کردو گۆری بە بەرگی ئەفرەنجی و سزای سەختی بۆ سەر پێچیکەران دیاری کرد . هەروەها شەریعەتی ئیسلامی لەحوکم کردندا لابردو گۆری بەیاسای مەدەنی رۆژئاوا .

بەم شێوەیە بتی داتاشراوی تورکیا ( ئەتاتورك ) هەڵسا بەدامەزراندنی دەوڵەتێك لەسەر بنچینەی عیلمانیەت و نەتەوەگەری و دینی ئیسلامی لەدەوڵەت و ژیان دوور خستەوەو سیاسەتی ( تەتریك )(١) ی بەسەر کوردو عەرەبی ناو تورکیادا سەپاندو پەیوەندی لەنێوان تورکیاو جیهانی ئیسلامدا بچراند . بەڵێ ئەتاتورك ژەهراویترین تیری وەشاند دژی گەلی کورد لەتورکیادا . قەسابخانەی ئاشکرا دانا بۆ سەر برینی کوردەکان بەکۆمەڵ ، بەبێ هیچ تاوانێك جگە لەوەی کە کوردن و موسڵمانن و نایانەوێت بەفەرمانی ئەم نالەبارە لەرێبازی دینەکەیان بچنە دەرەوە . ئەم ستەمکارە بەفەرمانی ئاغا ئەوروپاییەکانی هەڵسا بەم کارە نارەوایە ، بۆ ئەوەی برایەتی ئیسلامی لەنێوان کوردو تورکدا بپچرێنێت وئوممەتی ئیسلامی کەرت کەرت بکرێت و لەنێوان خۆیاندا برا کوژی بکەن .

هەروەها لەووڵاتی عەرەبیدا خوێندنگاو قوتابخانەکان بانگەوازی نەتەوەگەری عەرەبییان بلاو کردەوە ، بەهۆی چەندەها گاوری دڵسۆزەوە کە لەدەزگاکانی تەبشیردا بۆ ئەم مەبەستە ئامادە کرا بوون ، وەك بوترس بوستانی و ناصیف یازەجی و بەشارەت خوری . ئەمانە هەموو گاور بوون و خوویان بەم ئاگرەدا کردو چەندەها رێکخراوەو کۆمەڵەی نەتەوەگەرییان لەنێوان عەرەبەکانی سوریاو لوبنان و ناوچەکانی تری عەرەبیدا دروست کرد .

x x x x x

" ٩ "

کاتێك ئیمپریالیستە خاچ پەرستەکانی سەدەی بیستەم دەستیان کرد بە داگیر کردنی ووڵاتی ئیسلامو لەنێوان خۆیاندا بەشیان کرد ، عێراق بەر

---

(١) تەتریك : واتە : بەزۆر کردن بەتورك .

ئینگلیزەکان کەوت . گەلی کورد لەعێراقدا وەك شێری ژیان دژیان راوەستـــاو بەفەرماندەی قارەمانی کوردی موسڵمان شێخ مەحمودی حەفید کە ئاڵای جیهادی ئیسلامی هەلکردبوو . لەکوردستانی عێراقدا لەناوچەی سلێمانی بەرهەڵستی داگیر کەرانیان کردو ژمارەیەکی زۆر شەهیدو قوربانیان‌دا . هەروەها کوردەکان لەشۆرشی عێراقی ۱۹۲۰ ز دا ، دەورێکی باڵایان بینی . بەڵام بەداخەوە پەراوەکانی مێژوی نوێ باسی ئەم بەشداری کردنەی گەلی کوردیان شاردوتەوە . بۆیە پێویستە بە لێکۆڵینەوەو راست کردنەوە ئەکات . بێگومان بیرو رای نەتەوەگەری عەرەبایەتی بوتە هۆی شاردنەوەو پشت گوێ خستنی ئەم راستی‌یە .

دوای ئەوەی ئیمپریالیستەکان پشتیان هەڵکردو ناوچەکانی وڵاتی ئیسلامیان بەجێ هێشت ، چەندەها حکومەتی بەناو نیشتمانی‌یان لەجێگەی خۆیان دانا کە لەسەر بنچینەی عیلمانیەت‌و نەتەوەگەری دروست کرا بووە . بۆیە هیچ شتێك لەمەسەلەکە نەگۆرا . بەڵێ ئیمپریالیست لەرووی دەسەڵاتی سەربازیەوە رۆیشت . بەڵام بوونی فیکری‌و فەرهەنگی (۱) ، بەسەر سنگی موسڵماناندا هەر چوکی‌دا دابوو پیاوان‌و کاربەدەستانی رژێمە دروستکراوەکان هەر بەعەقڵیەت‌و بیرو هۆشی بێگانە بیریان ئەکردەوەو ئەجوڵانەوەو لاسایی کردنەوەی کوێرانە هەر بەردەوام بوو . بەهۆی هەستی سەر کزی‌و نابووتیان بەرامبەر شارستانێتی ئەوروپا . ئەمە لە لایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە کاربەدەستان لەپەروەردە کراوانی سەردەمی داگیر کردن بوون‌و بەشیرو شەکری ئیمپریالیست گۆش کرا بوون‌و لەئیسلام‌و واقیعی خەڵکی وڵاتەکەیان دوور کەوتبوونەوە . تەنها نوێنەرو هەڵگری بیرو رای نەتەو گەری ئەوروپایی‌و بێگانە پەرستی بوون‌و بەس . ئەو رق‌و کینەو دووبەرەکیەی ئیمپریالیستەکان لەنێوان تورك وعەرەب‌و کوردو گەلانی تری ئیسلامدا چاند بوویان ، ئەمان زیاتر کڵپەیان لێ هەڵگیرساندو تا بهاتایە دوژمنایەتیەکەیان قوڵتر ئەکرد .

عەرەبە رەگەز پەرستەکانی کاربەدەستانی بەغدا لەهەموو سەردەمێکدا بە فەرمانی ئاغاکانیان هەڵساون بەچەوساندنەوەی گەلی کوردو پێ شێل کردنی مافی رەوایان . ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە گوێ لەشتەکانی بێگانە هەڵسان بەهاندانی کوردەکان‌و رق‌و کینەیان لەدڵ‌و دەروونیاندا چاند بەرامبەر ئیسلام. چونکە وایان تێگەیاندن کە گوایە ئیسلام بوومتە هۆی ئەوەی عەرەب گەلی کورد بچەوسێنێتەوە . بەڵام لەراستی‌دا کاربەدەستانی عەرەبی ئەم سەردەمە زۆر لە

---

(۱) الوجود الفكري والثقافي .

ئیسلام دوورن‌و گۆشکراوی بێگانه‌ن‌و ئه‌و پارت‌و کۆمه‌ڵه سیاسیانه ئه‌نوێنن که به‌رنامه‌ی عیلمانی‌و تیوّری نه‌ته‌وه‌گه‌ری‌یان کردوّته ڕێبازی خوّیان که له‌سه‌ر بنچینه‌ی جیاوازی خوێن‌و نه‌ژادو زمان دامه‌زراوه.

ئه‌م کاربه‌ده‌ستانه هه‌میشه وه‌ك كه‌مایه‌تیه‌ك بۆ گه‌لی کورد ئه‌روانن ئایا ئه‌بێ کورده‌کان هه‌ڵوێستیان چوّن بێت به‌رامبه‌ر ئه‌م خروّشانی نه‌ته‌وه‌گه‌ری‌یه ؟ ! کوردی موسڵمان ئه‌بێ چی لێ چاوه‌روان بکرێت ،کاتێك ئه‌بینێ هه‌ر عه‌ره‌به‌و ئالآی عه‌ره‌بایه‌تی هه‌ڵگرتووه‌و هه‌ر تورکه‌و بانگه‌وازی تورانیه‌ت به‌رز ئه‌کاته‌وه‌و هه‌ر فارسه ره‌گه‌زی فارسیه‌ت زیندو ئه‌کاته‌وه ؟ !

ئه‌وه‌ی زیاتر زامی گه‌لی کورد قووڵ‌و سامناك کردووه ئه‌و چه‌وساندنه‌وه نه‌ته‌وه گه‌ریه‌یه که له‌لایه‌ن عه‌ره‌ب‌و تورك‌و فارسه‌وه دوچاری هاتوون ،له‌هه‌موو روویه‌کی ژیان‌و شارستانێتی‌یه‌وه پشت گوێ خراون‌و وه‌ك كه‌مایه‌تیه‌ك ماڵه ئه‌کرێن ، به مه‌رجێك ژماره‌ی کورد ته‌نها له‌عێراقدا زیاتره له‌ژماره‌ی هه‌موو گاوره‌کانی دانیشتووی ووڵاتانی عه‌ره‌بی . بوّیه ئێستا وایان لێ‌هاتووه له‌م زه‌ویه‌دا خوّیان به‌غه‌ریب ئه‌زانن هه‌ر چه‌ند له‌ناو نیشتمان‌و زه‌وی‌و زاری بنه‌ره‌تی خوّیاندا ئه‌ژین . ئه‌مه‌ش به‌هوّی ئه‌و بانگه‌وازه نه‌فامی‌یه‌وه‌یه که له‌سه‌ر بنچینه‌ی خۆر بوونه‌وه‌ی گیانه‌وه‌ریی‌و مادییه‌ت دامه‌زراوه . کاتی خوّی پێغه‌مبه‌ری مه‌زن -درودو سه‌لامی خوای لێ بێت -هاواری کردووه : " دعوها فانها منتنة " . واته : ده‌ستی لێ هه‌ڵگرن‌و لێی دوور که‌ونه‌وه چونکه بوّگه‌نه . مه‌به‌ستی نه‌ته‌وه‌گه‌ری‌و ره‌گه‌ز په‌رستی‌یه .

گه‌لی کوردی موسڵمان نزیکه‌ی سێ یه‌کێکی دانیشتوانی عێراق پێك ئه‌هێنن، که چی کاربه‌ده‌سته ره‌گه‌ز په‌رسته‌کانی به‌غدا هه‌میشه به‌چاوی که‌مایه‌تی بوّیان ئه‌روانن . چه‌وساندنه‌وه‌و کوشتن‌و برین‌و شارو دێ سوتاندن‌و گوێزانه‌وه‌و کـردن به‌عه‌ره‌ب پیشه‌ی به‌رده‌وامیانه .

جگه له‌عێراق گه‌لی کورد ڕێژه‌یه‌کی گه‌وره له‌دانیشتوانی تورکیاو ئێران پێك ئه‌هێنن . هه‌روه‌ها ژماره‌یه‌کی باشیان له‌رووسیاو سوریاو لوبنان ئه‌ژین . باری ژیانی ئه‌وانیش له‌باری ژیانی کوردی عێراق چاکتر نیه ،به‌ڵکو خراپتره . ئه‌م هه‌موو کاره ده‌روونی‌و کوّمه‌ڵایه‌تی‌و ئابوری‌و نه‌ته‌وه‌یی‌یانه بوو به‌هوّی قووڵ کردنی رق‌و کینه‌ی نه‌ته‌وه گه‌ری له‌لایه‌ن کورده‌کان‌و زه‌مینه ته‌خت بوو بوّ ده‌ستی چه‌په‌ڵی سوور له‌مه‌یدانی گه‌لی کوردی موسڵماندا . ئه‌م گرێ سه‌ره‌تا نیه ( عقدة سرطانیة ) له‌م دواییه‌دا له‌ناو جه‌رگه‌ی کوردستاندا جێگه‌ی خوّی کرده‌وه ، پاش ئه‌وه‌ی به‌رگێکی نه‌ته‌وه گه‌ریان لێ پوّشی‌و به‌ناوی رزگار کردنی گه‌لی کوردی

ستەم لێ کراوەوە ، زۆر لەگەنجەکان هەڵ خەڵەتان و شوێن ئەم بیرو را پووچەڵـــە کەوتن ، گوایە چاکترین ڕێبازە بۆ رزگار بوون . بەڵام نازانن ئەمەش پیلانێکـــی تری فیکریی ئیمپریالیستی نوێیەو ئەیانەوێت لەم ناوچە ستراتیژیەدا دەسـەڵاتی خۆیان جێگیر بکەن و لەسەر حسابی کوردی هەژار ئامانجە گڵاوەکانیان بهێننە دی ئایا ئەبێ عەرەب و تورك و فارس بەتەمای چی بن لەگەڵی کورد ؟ ! لەکاتێکـــــا ئەوان بوون بەهۆی دوور کەوتنەوەی ئەم گەلە لەئیسلام و حوون بەبیری بیرو رای نەتەوە گەری و مارکسایەتیەوە . کوردی هەژار ئەبێ چی بکات کەعەرەب و تـــورك و فارس ئەبینێت لەگشت لایەکەوە سەریان تێ کردوەو ئەی چەوسێننەوەو بەچاوی سوك بۆی ئەروانن ؟ ! ئەبێ هەڵوێستی کورد چۆن بێت ، کەئەروانێت عەرەبەکـان نەوەی پێغەمبەرو هەڵگری یەکەمی ئاینی ئیسلامن ، خۆیان لەئیسلام داماڵیـــوەو کوردی موسڵمان ئەگوێزنەوە بەگاوری بەکرێ گیراوی ئیمپریالیستی خاچ پەرست ؟ !

ئەم کوردە موسڵمانە لەناخی دڵو دەروونیەوە عەرەبی موسڵمانی خۆش ئەوێت و نایەنەوێت لێی جیا ببێتەوە . بەڵام چی ئەکەی کەعەرەب دروشمی نەتەوە گەری و عیلمانی هەڵگرتووەو دەستی لەبرایەتی ئیسلامی هەڵتەکاندوە ؟ بێ گومان هیچی بۆ نامێنێتەوە جگە لەبەرپا کردنی ئاڵای نەتەوە گەری بۆ پاراستنی بـــوون و شەخسیەتی مێژوویی خۆی .

ئا بەم شێوەیە عەرەبەکان پێش هەموو کەس هاوکاریان کرد لەدوور خستنەوەی ئەم گەلە زۆر لێکراوەدا لەخۆیان و لەئیسلامیش . بێگومان لەبەردەم دادگـــــان خواییدا بەرامبەر ئەم تاوانە گەورەیە بەر پرسیار ئەبن . چونکە ئەوان بـــــوون دەماری نەتەوە گەری و رەگەز پەرستی جاهیلی یان لەم ناوچەیەدا زیندو کـردوە .

ئێمە دڵنیاین ئەگەر بێت و گەلی کوردی موسڵمان دەستی دڵسۆزی و برایەتی لەژێر ئاڵای ئیسلامدا لەلایەن عەرەبەوە بۆ درێژ بکرێت ، ئەوا بێگومان بیرو رای نەتەوە گەری و دوور لەخوایی لەناو کوردەکاندا هیچ بایەخێکی نامێنێ چونکە ئەم بانگەوازە نەفامی یە لەناو کوردەکاندا تەنیا کاردانەوەیەکی ئاشکرایە دژی ئـــــەو چەوساندنەوەو ئەشکەنجەیەی لەلایەن هەڵگرانی بیری نەتەوە گەرییەوە خراوەتـە سەریان . ئەم بانگەوازە لەلای گەلی کورد بەرهەمی بارێکی تایبەتی و ویژدانی یـە ، نەوەك بەرهەمی فەلسەفەیەکی بێ باوەری بێگانە بێت وەك لەلای عەرەبەکانە ،

کوردەکان برای عەرەب و تورك و فارسی موسڵمانن و سورن لەسەر پاراستنــــی ئەم برایەتیە ئیسلامی یە ، ئەگەر بێت و ئەوان بەراستی ئیسلام بن . ئەم هەڵوێستە کورد بەرامبەر ئیسلام بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئیسلام دینێکی تایبەت نـــیـە تەنها بۆ عەرەب ، بەڵکو بۆ گشت نەوەی ئادەمە . بەڵام شوێنکەوتوانی بـیرورای

نەتەوەگەری ئەیانەوێ بەخەڵکی بگەیەنن کە تەنیا بۆ عەرەبەو هەر ئەوان سودی لێ وەرئەگرن . مەبەستیان ئەوەیە ئەم پەیوەندیە جاهیلی‌یە بخەنە جێی پەیوەندی ئیسلامی کەپیرۆزترین‌و شایستەترین پەیوەندیە مرۆڤەکان لەسەری کۆ ببنەوە .

پەیوەندی نەتەوەگەری لەئەنجامی رەفتاری رەمەکیی کۆمەڵی گیانەوەرانەوە پەیدا بووە . ئەم بۆ چوونە زۆربەی زانایانی کۆمەڵ ناسی لەسەری ریکەوتوون . کەواتە هەستی نەتەوەگەری هەستێکی سەرەتایی گیانەوەری‌یە کە لەرەمەکەوە (الغریزة) دەرئەچێت ، نەوەك بیرێك بێت کەباوەرو فەلسەفەیەکی پتەو پەیدا بکات دەربارەی گەردوون‌و ژیان‌و مرۆڤ ،بۆ ئەوەی کۆمەڵگەیەکی لەسەر بنیات بنرێت شایستەی ئادەمی بێت .

ئەگەر بێت‌و کۆمەڵگەیەکی ئیسلامی راستەقینە پێك بهێنرێت ، ئەوا کوردەکان بەهیچ شێوەیەك خۆیان بەنەتەوە گەریەوە خەریك ناکەن‌و بەخۆشی‌و کامەرانی لەگەڵ برایانی موسڵمانیاندا ئەژین لەعەرەب‌و تورك‌و فارس‌و گەلانی تر . بەلام ئاخۆ رەگەز پەرستانی نەتەوە گەری ئەمرۆ ئەم راستی‌یە تێ ئەگەن ، لەکاتێکا تا تەوقی سەریان لەزەنگاوی جاهیلی نەتەوە گەری‌دا نقوم بو ؟!!

" ١٠ "

پێویستە تێبینیەکی تر ئاراستەی هەڵگرانی ئالای نەتەوە گەری عەرەب بکەین : ئایا بۆچی دنیا بە یەکا ئەدەن کاتێك باسی جێبەجێ کردنی ریبازی ئیسلامی بکرێت ؟! بۆچی بۆ حالی کەمایەتیە ئاینیەکانی گاورو جولەکە ئەگرین ؟ ئەڵێن ئەوانە بۆ کوێ برۆن‌و چی بکەن ئەگەر بێتو ئیسلام لەژیاندا جێبەجێ کرێت ؟ گوایە دژایەتی ئاینی لەنێوان رۆڵەکانی یەك گەلدا دروست ئەبێت ! ئەم بیانووە پرو پووچە ئەکەن بەداردەست بۆ ئەوەی دەست لەئیسلام هەڵتەکێنن .

ئایا لە چ کاتێکا لەسەردەمی زێرینی ئیسلامدا کەمایەتیە ئاینیەکان چەوسێنراونەتەوە یا مافیان خوراوە ؟! ئایا هەروەك موسڵمانەکان لە مافو پێویستیەکاندا مامەڵە نەکراون ؟! ئایا وەك موسڵمانەکان بەشداری خۆشی‌و تەنگانەیان نەکردوە ؟! ئایا ئیسلام کەبەرنامەی خوایە چاودێری مافی هەموو لایەکی نەکردوە بگرە گیانەوەرانیش ؟!

ئەی بۆچی تۆزقاڵێك دڵیان بۆ گەلی کوردی هەزار ناسوتێت ،کە ژمارەیان تەنیا لەعێراقدا زیاترە لەژمارەی گشت کەمایەتیە ئاینیەکانی جیهانی عەرەب ؟ ئایا چ تاوانێك لەوە گەورەترە،گەلی کورد بەکەمایەتیەکی نەتەوەیی بدرێتە لەڵەم ؟! بەمەرجێك مێژویەکی مەزن‌و پرشنگداری هەیە لەگەڵ برایانی عەرەبی

موسڵمانیدا بۆ پاراستنی رۆژهەڵاتی ئیسلامی! ئایا تاوان نیە کەلی کورد وەك کەمایەتیەکی نەتەوەیی سەیر بکرێت کەفەرماندەی قارەمانی وەك ( صلاح الدین ) یان تیا هەڵکەوتوەو ( قودسی پیرۆز ) و زۆربەی ناوچەکانی سوریاو لوبنـــان و فەلەستین و میسری لەچنگی درندەترین دوژمنی ئیسلامو کەلی عەرەب رزگــار کرد ؟ !

پێش ئەوەی ئەم پێشەکیە کۆتایی پێ بهێنین ، پێویستە ئەو راستیە بزانین کە :

مەسەلەی کورد یەکێکە لەگیروگرفتە گرنگەکانی جیهانی ئیسلامی ، چونکـــە مەسەلەی کەلێکە کە بەتەواوی مێژوویەکی پر لەشانازیو ئازایەتی هەیەو لـــە رابوردووی ئیسلامیدا پلەی سەرکردایەتیان کرتوتە دەستو دەوڵەتێکی ئیسلامـــی فراوانیان دامەزراندوەو ئاڵای جیهادیان بەرز کردوتەوە لەترسناك ترین قوناغدا کە بەسەر رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا هاتووە .

ئەم مەسەلەیە پێویستی بەلێکۆڵینەوەو ماندوبونێکی دڵسۆزانە هەیە . کە لەبنچینەی توێژینەوەو راستکردنەوەیەکی وردو زانستیانە ئەنجام بهێنرێتو سود لەنوسینو تۆمار کراو و سەرچاوە زانستیە باوەر پێکراوەکان وەربگیرێت . بـــۆ ئەوەی مێژووی ئەم کەلە ستەم لێکراوە روون بکرێتەوەو بناسرێت . بەو هیوایەوە کەببێتە هۆیەکی کاریگەر بۆ ژیاندنەوەی کیانی ئیسلامی سەر لەنوێ .

ئەم پێشەکیە پێویستە بۆ ئەوەی ببێتە چرایەك بۆ کشت ئەرکێکی مێژوویـــی ئەم کەلە موسڵمانە بکۆڵێتەوە کە پریەتی لە پەندو ئامۆژکاریو هەڵوێستی پـــر لەشانازی .

ئیتر سوپاس و ستایش هەر شایانی خوای پەروەردگارە

× × × × ×

# مقدمة
# في التأريخ
# الاسلامي الكردي

باللغة الكردية

بقلم
هادي علي